زنجیرەی جوانترین چیرۆك لە فەرموودەكانی پێغەمبەری خوا (ﷺ)

# خۆشەویستی لەبەر خوا



تصوير ابو عبدالرحمن الكردي

المكتب الاسلامي
AL-Maktab AL-Islami

الدار العربية للعلوم





| | |
|---|---|
| نـــــاوی کتێـــــــب: | زنجیرەی جوانترین چیرۆك لە فەرموودەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ: (خۆشەویستی لەبەر خوا) |
| نـووسیـــــــنـــــی: | شادی فقیه |
| وەرگـــــــــێڕانی: | سەردار ڕەزا |
| پێداچوونەوەو هەڵەچنی: | محەمەد مێرگەیی |
| نـەخشەسـازی ناوەوە: | کۆمپیوتەری نارین (محمد علی) |
| چـــاپی یەکـــــەم: | ٢٠١٠ |
| نۆرەو ساڵی چـــاپ: | دووەم ٢٠١١ |
| شـــوێنـی چـــاپ: | بەیروت - لوبنان |
| ژمـارەی سپـــاردن: | (٢٥٨٦)ی ساڵی (٢٠١٠)ی پێدراوە |

نارین

بۆ چاپو بڵاوکردنەوە

بازاڕی زانست بۆ کتێب و چاپەمەنی

Website:www.nareenpub.com

E-mail: info@nareenpub.com

تەلەفۆن: ٢٥١١٩٨٢ ٦٦ (٠٠٩٦٤)

مۆبایل: ٠٠٩٦٤ ٧٥٠٤٠٦٤٦١٠



الدار العربية للعلوم
Arab Scientific Publishers

المكتب الاسلامي

زنجیرەی

جوانترین چیرۆك

لە فەرموودەكانی پێغەمبەری خوا (ﷺ)

# خۆشەویستی لەبەر خوا



**نووسینی**

شادی فقیە

**وەرگێڕانی**

سەردار ڕەزا




الدار العربية للعلوم
Arab Scientific Publishers

ناشرون

المكتب الاسلامي
AL-Maktab AL-Islami

شنەی با کەشێکی شاعیرانەی دەخستە سەر ڕووناکی مانگ و هەواڵی شەوانەیەکی جوانی دەبەخشی.

ئیبراهیم و فاتیمەی خوشکی لە ژووری کتێبخانەکەدا چاوەڕوانی باوکیان دەکرد، تا بێت بۆ لایان و چیرۆکێکی جوانیان لە فەرموودەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ بگێڕێتەوە.

فاتیمە: ئیبراهیم ئەمڕۆ تۆ لە کوێ بوویت؟

ئیبراهیم: ئەمڕۆ سەردانی ئەحمەدی هاوڕیم کرد، لەبەرئەوەی نەخۆشە و نەهاتبوو بۆ قوتابخانە.

فاتیمە: بەڵام زۆر دواکەوتیت.

ئیبراهیم: بەڵێ، لەبەرئەوەی وانەکانی ئەمڕۆم بۆ دەنووسیەوە، کە لە قوتابخانە وەرمان گرتبوو.

فاتیمە: داوا لە خوای پەروەردگار دەکەم لەو نەخۆشییە چاکی بکاتەوە.

ئیبراهیم: هەروەها منیش دوعای چاکبوونەوەی بۆ دەکەم، من لەبەر خوا ئەحمەدم خۆشدەوێت.

لەم کاتەدا باوکیان بەسەر ئەم قسەیەی ئەحمەددا هاتەژوورەوە، بە سڵاوکردن دەستپێشخەری لێکردن.

باوك: سڵاوتان لێبێت کوڕ و کچە شیرینەکەم.

مناڵەکان: سڵاو لە تۆش باوکی خۆشەویستمان.

باوك: ئیبراهیم وشەی (لەبەر خوا خۆشم دەوێ)تم لێ بیستیت.

ئیبراهیم: بەڵێ بابەگیان، ئەوە باسی ئەحمەدی هاوڕێمم بۆ فاتیمە دەکرد.

باوك: بە بۆنەی ئەوەوە کە قسە لەسەر (خۆشەویستی لەبەر خوا) دەکەین با چیرۆکێکی جوانتان لەو بارەیەوە بۆ بگێڕمەوە، کە پێغەمبەری خوا ﷺ کاتی خۆی بۆ هاوەڵە بەڕێزەکانی گێڕاوەتەوە.

مناڵەکان: زۆر جوانە بابەگیان.

باوك: لە سەردەمی زوودا دوو برای باوەڕدار هەبوون، کە لەبەر خاتری خوا یەکتریان خۆشدەویست، یەکێکیان ڕۆیشت بۆ وڵاتێکی دوور، ڕۆژێك لە ڕۆژان هاوڕێکانی زۆر بیریان کرد و بەپەرۆشەوە بوون بیبینن.

پیاوە باوەڕدارەکە: دەزانی زۆر بیری عەبدوڵڵای برامان دەکەم.

باوەڕدارەکەی تر: منیش بەهەمان شێوە زۆر بیری دەکەم.

پیاوەکە: ئەوە ماوەیەکە هەواڵی نازانین.

ئەوی تریان: تۆبڵێی تووشی ناڕەحەتییەك نەبووبێ؟

پیاوەکە: لەوانەیە لە ناڕەحەتییەك دابێت، یان پێویستی بەوە هەبێت کەسێك یارمەتی بدات.

ئەوی تریان: کوڕە پێویست ناکات بەو شێوەیە خۆمانی بۆ دڵتەنگ بکەین.

پیاوەکە: دەڵێی چی ئەگەر بڕۆین سەردانێکی بکەین، تا لە کاروباری دڵنیابین.

ئەوی تریان: بەڵام ئەو لە وڵاتێکی دوورە و ماوەی نێوانمان زۆرە.

پیاوەکە: دووریی گرفت نییە.

ئەوی تریان: وازمان لێبهێنە با چاوەڕوان بین، بەڵکو هەواڵیمان پێ بگات، یان ئەو خۆی بهێت بۆ سەردانمان.

پیاوەکە: نا... گەر خوا ویستی لەسەربێت من دەچم بۆ سەردانی، تۆش ئەگەر دەتەوێت وەرە لەگەڵمدا.

ئەوی تر: سڵاوی منی پێ بگەیەنە و پێی بڵێ: ئێمە زۆر بە پەرۆشەوەین بۆی و با دوعای خێرمان بکات.

پیاوەکە: خوا بیکات پێی دەگەیەنم... کەواتە براکەم بە خوات دەسپێرم.

ئەوی تر: بە ویستی خوا سەرکەوتوو دەبیت.

باوك: پیاوە باوەڕدارەکە دەرچوو... ڕۆیشت ڕێگا دوور و درێژە پڕ لە ناڕەحەتییەکەی دەبڕی بۆ ئەوەی سەردانی برا باوەڕدارەکەی بکات.

پیاوەکـــە: ئـــای کـــە ڕێگایـــەکی دوور و نارەحەتە، بەڵام هەر دەبێ بەرگەی بگرم بۆ ئەوەی لەلای خوای پەروەردگارەوە پاداشتی لەسەر وەربگرم.

بـاوك: هـەرواش بـوو خـوای پـەروەردگار ئاگاداری باوەڕی تەواوی ئەو بوو بە خوای گەورە، بە پاداشتێکی گەورە خەڵاتی کرد و مژدەی خێر و چاکەیەکی گەورەشی پێدا.

فاتیمە: ئەمە چۆن بوو بابەگیان؟

باوك: كاتێ پیاوە باوەڕدارەکە نزیك بۆوە لەو شارەی هاوڕێکەی لێیە، پیاوێك هاتە سەر ڕێگاکەی.

پیاوە نامۆیەکە: ئەی پیاوچاك تۆ بۆ کوێ دەچیت؟

پیاوە باوەڕدارەکە: دەمەوێت لەو شارەدا سەردانی برایەکم بکەم.

پیاوە نامۆیەکە: ماشەڵا... ئایا بۆ ئەوە دەچیت بۆ لای کە پێویستییەکت بۆ جێبەجێ بکات؟ یان بەرژەوەندییەکت لەگەڵیدا هەیە؟

پیاوە باوەڕدارەکە: نەخێر.

پیــاوە نامۆیەکــە: لەوانەیــە داوای پارەیــەکی خۆتی لێ بکەیت، یان سوودێکی لەو جۆرە؟

پیاوە باوەڕدارەکە: نەخێر بۆ ئەوە نییە.

پیـاوە نامۆیەکـە: ئـەی باشـە بۆچـی دەتـەوێت سەردانی بکەیت؟

پیاوە باوەڕدارەکە: چونکە من لەبەر خوا خۆشم دەوێـت.

پیاوە نامۆیەکە: لەبەرخوا! بۆچی؟

پیاوە باوەڕدارەکە: لەبەر ئەوەی هیوام وایە، خوای گەورە منی خۆشبوویت هەروەکو من چۆن ئەو برا باوەڕدارەمم لەبەر خوا خۆشدەویت.

پیاوە نامۆیەکە: خوای گەورە بەرەکەتدارت بکات، خوای پەروەردگار وا وەڵامی دایتەوە، من نێردراوی خوام بۆ لای تۆ، تاوەکو هەواڵی ئەوەت پێ بدەم، کە تۆ چۆن هاوڕێکەت لەبەر خاتری خوا خۆشدەوێت، ئەوا خواش تۆی خۆشدەوێت.

ئیبراهیم: کەواتە، ئەو پیاوە نامۆیە یەکێك بووە لە فریشتەکانی خوای پەروەردگار!

فاتیمە: بەڵێ، خوا ناردوویەتی بۆ ئەوەی بچێت بۆ لای ئەو پیاوە باوەڕدارە و ئەو مژدەیەی بداتێ، کە خواش ئەوی خۆشدەوێ.

ئیبراهیم: کەواتە سبەینێش سەردانی کێ بکەم ....؟

فاتیمە: من سەردانی خەدیجەی هاوڕێم دەکەم لەبەرئەوەی منیش ئەوم لەبەر خوا خۆشدەوێت.

باوک: ئافەرین ڕۆڵەکانم، پێغەمبەری خواوە ﷺ، فەرموویەتی: ((أوثقُ عُرَى الايمانِ الحبُّ في اللّٰهِ)) هەروەکو خوای پەروەردگار پاداشتی گەورەی ئامادەکردووە بۆ ئەوانەی لەبەر خاتری خوا یەکتریان خۆشدەوێت.

منداڵەکان: بابەگیان زۆر سوپاست دەکەین بۆ ئەم چیرۆکە جوانەی بۆت گێڕاینەوە.

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموویت:

((إن رجلاً زارَ أخاً له في قريةٍ أخرى فأصدَ الله لهُ على مَدْرجتهِ مَلَكاً فَلَمّا أتى عليه

قال: أينّ تُريد؟

قال: أريدُ أخاً لي في هذه القريةِ.

قال: هل لك عليه من نعمةٍ تَربُها؟

قال: لا. غيرَ أني أحببتُه في اللهِ عزَّ وجلّ.

قال: فإني رسول الله إليكَ بأنَّ الله قد أحبَّك كما أحببتُه فيه)).

موسلیم گێڕاویەتییەوە(٢٥٦٧).

زنجیرەی جوانترین چیرۆك لە فەرموودەكانی پێغەمبەری خوا (ﷺ)

## خۆشەویستی لەبەر خوا



المكتب الإسلامي
AL-Maktab AL-Islami

زنجیرەی جوانترین چیرۆك لە فەرموودەكانی پێغەمبەری خوا (ﷺ)

## كەچەڵ و بەڵەك و نابیناییەكە



المكتب الإسلامي
AL-Maktab AL-Islami

زنجیرەی جوانترین چیرۆك لە فەرموودەكانی پێغەمبەری خوا (ﷺ)

## پیاو چاكەكە



المكتب الإسلامي
AL-Maktab AL-Islami

زنجیرەی جوانترین چیرۆك لە فەرموودەكانی پێغەمبەری خوا (ﷺ)

## هاوەڵانی كەشتییەكە



المكتب الإسلامي
AL-Maktab AL-Islami

ISBN 9953-29-657-X

